PDF 4 KURD

ناو: دەمەویٚ شتێك بگریم

بابەت: شیعر

نووسەر: ڕەوشت مەحەممەد

بەرگ: سەیوان سەعیدیان

دیزاینی ناوەوە: کەیوان عەبدوڵڵا

تایپ: زەکەریا عەبدوڵڵا

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانە:

ژمارەی سپاردن:

لە بڵاوکراوەکانی: ڕۆژنامەی کۆمەڵ ـ ژمارە شەش



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

# ناوەڕۆك





PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

**پێشکەشە:**

ـ بە دایکم لێرەو باوکم لەوێ.

ـ بە "نیشان" تکا دەکەم، مشتێ منالّیم بۆ بهێنە
لێرە لە نێو خەراباتی گەورەیی منا بیڕوێنە.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

***"چرایەك لەنێو دڵمداو چرایەکیش بەدەستمەوە، ئەچم بۆ شەڕی تاریکی"***
*"ئەحمەدی شاملو"*

تاریکی هاتۆتە حەوشەی ماڵەکانمان
لەگەڵ گوڵی بەردەرگاکەمانا دەئاخفێ
هاتووە لەنێو گوڵدانەکانمانا بڕوێ
تاریکی لەحەوشەی قوتابخانەدا
لەگەڵ مناڵەکانماندا یاری تۆپی پێ ئەکا
بەشێك لەڕەنگی دەفتەر ڕەسمەکانیان پڕئەکاتەوە
تاریکی لەگەڵ داری مامۆستاکەدا
دەڕژێتە نێو دوو دەستی ئەو قوتابییەی
ئەمڕۆ تەحزیری نەکردووە
گوێ لە چپەچپی من وهاوڕێکەم دەگرێ
چەند بەجەرگو چاونەترسە تاریکی
لەگەڵ هەنگاوە ڕوونەکانی قوتابیانی زانکۆدا
ئەیەوێ بچێتە ژووری
تاریکی لەهۆڵی موحازەرەکاندا
خۆی دەخزێنێتە لای خەیاڵی قوتابیانەوە
تاریکی عاشقانە دێو
داوای خۆشەویستی لەقوتابییان دەکا
ماچی خۆی ئەبەخشێنێتەوە



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

تاریکی تازەترین داگیرکەری ئێمەیە
هەموو ئاگر بڕەکانی شکاندو
هاتۆتە ولاٌتەکەمانو
شارەکانمان پڕن لەخێزانی داگیرکراو
پڕن لەگەنجی داگیرکراو
پڕن لەقوتابیو مامۆستای داگیرکراو
سەیر نەبێ بەلاتانەوە
شیعرێك داوای شەڕی ناوخۆتان لێئەکا
پێویستە شەڕێ هەلٌگیرسێ
شەڕێ دەروونی خۆمانو
مالٌو خێزانەکانیشمان بگرێتەوە
شەڕێ هەلٌگیرسێ لەجادەو
لە شەقامو شارەکانا
پێویستە شەڕی ئەمجارە
بچێتە نێو قوتابخانەو زانکۆکانیش
شەڕێك لەدژی داگیرکەر
خۆمان ببینە سەربازو
بچینە سەنگەری شەڕ
وەرن با ئێمە کارێ کەین
بۆیەکەمجار شەڕێکی جوان تۆمار بکەین
دلٌنیابن



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

شەڕی ئەمجارە هیچ منالێ هەتیو ناخا
دڵنیابن
دڵی هیچ دایکێك ناگوشێ
دڵنیابن
خوێن لەپەنجەی کەس ناهێنێ
دڵنیابن
شەڕی ئەمجار دڵ لە زیکری ژیان ناخا
وەرن شەڕێکی جوان بنووسین
چرایەك لەنێو دڵماناو ،
چرایەکیش لەسەر دەستمان
ئاوا... ... بچین بۆ ئەم شەڕە .



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

## دایکانێك میهرەبانتر لەگەڵای درەخت

**سهرابی سوپهەری**

نا. .
دەریا کۆناکرێتەوە!
ئەم کارە بەقەد
نووسینەوەی میهرەبانی دایك ئەمترسێنیٚ
من.. تا ئەگەمە بەردەم دەریا
وشەکانم هەموو دەخنکێن،
ئەوان هیچکام
شەڕی ئەم (وشە)یەم بۆ ناکەن
ئەم شەڕەم بۆ نابەنەوە
دەریام بۆ کۆناکرێتەوە
هەر دەڵێی هەرچی سۆزە
لەچاوی دایکەوە دەڕژیٚو
پەپولەو گوڵ بەشی خۆیان هەڵدەمژنو
ئێمەش بەشی خۆمان ون دەکەین
هیچ نامێنیٚ بۆسەر کاغەز
دایك ناچێتە سەر کاغەز
دایك ناچێتەو نێو دێڕو دەروونی بچووکی وشەکان
ئەوەی بۆ دایك ئەنووسریٚو



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

ئەوەش لەمنی ئەبیستن
هیچ نییە چەند دێڕێك نەبێ
بۆنی دایكیان لێوە دێ
ئەگەرنا من
كە ئەگەمە بەردەم دەریا دەخنكێمو
لەبەردەم میهرەبانیدایكیشا دەترسێم
من بۆ دایك هیچ نانووسم
ئەمن شەڕی خۆشەویستی و
شەڕی كۆكردنەوەی دەریاو
شەڕی دایكم پێناكرێ.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

باران شیـعری تەڕی خــوایە
قەصیدەیەکی یاخییە، لەزمانی شەختە ئەنووسیٚ و
بــەدەنــگی بەفــر ئەپەیڤیٚ و بـەتەرزە بـیرئەکــاتەوە
قەصیدەیەکی یاخییـە کاتیٚ خۆی ئەنـووسێتەوە
دەرگای ئاسمان لەسەر زەوی دائەخات و
بەشیعر تەڕ تەڕ مان ئەکات .

حەزم لێیە بەتۆ بنووسم ئەی باران
فێری زمانی خۆتمکە
تا بەس شیعر بدەم لەسێدارەی وشە
فێری زمانی خۆتمکە
دابزانم  مانگە شەو لەژێر بارانا
شەرمی لێدەتکیٚ یاتریفە
فێری زمانی خۆتمکە
دابزانم لەژێر بارانا هەنگاوم
زەوی تەی دەکەن یائاسمان
داخۆ بەژێر بارانەوە چاوم دەبینیٚ یا پەنجەم
دەستم دەنووسیٚ یا جەستەم
فێری زمانی خۆتمکە
فێری مۆسیقای داباریـن
بمدەریٚ لەوشەی باریو



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

ڕستێ لەدێڕی ئاوی‌خۆت .
پۆلێ خاڵبەندی پاساری
بڕژێنە نێو نووسینمەوە
تاچۆڵەکە بمهێنێتەوە سەری دێڕ
باجریوە دێرەکانم پێڕا گرێ‌ۆ
بمخاتەسەر لەرە لەری بیرکردنەوە
فێرمکە وەك خۆت هەزار چاو
داباریێنم بەسەر هەزار نیشتمانا
ببمە هەزار دەست و پەنجەو چاوی باریو
چاوێکم لەسەر بەرزایی
ئەهرامەکانەوە برژێ و
بیرکردنەوەم لە ئاسمانی یۆنان داکا
سەرزەوی سوقرات بخوسێنێ
پەنجەیەکم ڕیشی بوزا شانە بکاو
دەستێکم لاپەڕەی قورئان هەڵباتەوە
فێرمکە باران وەکو خۆت
ببمە هەزار دەست و پەنجەو چاوی باریو
چاوێم برژێتەئەوێو
نۆتەی جێماوی پێش مەرگی
بتهۆڤن بخوێنێتەوە
پەنجەیەکم لەسەر زەوی عەر عەر بڕوێو



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

هەرچی قەصیدەی ژێر خاکە
لەمێژوویان مارە بکا
حەزم لێیە بەتۆ بنووسم ئەی باران
ئالودەمکە بە نووسینێ
لەتەڕبوونی سەوزە گیا
ئالودەمکە بەنووسینی
خزین بەسەر لەپی دەریا
ئالودەمکە بەنووسینی
ئێشی خونچە کەپەی بەپشکوتن دەبا
چاوم بۆ تۆو فێرمکە چۆن
بەسەر باخێکا دابارێم
دەستم بۆتۆو فێرمکە چۆن
داوێ بۆ پەلکە زێڕینە بنێمەوە
لێوم بۆ تۆو فێرمکە چۆن
بەیانییەك بەماچی تەڕ
گوڵێ بەئاگا بێنمەوە
لەخەوی تەنگی نێو خونچە
هەموو شیعرەکانم بەرەو
وەشتێ لەنمەی شیعری خۆت
بڕژێنە نێو چاوانمەوە
تابینینی منیش تەڕبێ



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

وەك بینینی تەڕی کانی وەختێ ئەزێ *
وەك بینینی دایکم کاتێ
تەماشای ئایندەئەکا
فێرمکە باران بنووسم
تەڕمکە تەڕ ........تەڕ
بەنووسین .

***بەکار هێنانی وێنەیەکی شیعریی "نالی" یە**



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com



## ئەمەوێ کەمێکت بۆ بنووسم، یانی شتێك بۆت بگریم



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

**هەردەم لەسەفەردا حەزەرییە لە وەتەندا**
**غوربەتکەشو عاجز بەئەگـــەر ئەهلی تەریقی**
**( نالی)**

ئەمەوێ شتێکت بۆ بنووسم
لە وشە ورشی ئەو هەموو یادەوەریەی نێوانمان بچێ....
ئەو هەموو یادەروەریانەی
تا چاو بڕکا بەشیعر دەوور دراون...
تۆ لەمبەری ئەمبەرەوەو
منیش لەو سەری ئەوسەر...
هێندە لەیەکەوە دوور بووین ...
هاوارەکانمان شینایی دەریا ئەیبردنوو ئەخنکان
هاوارەکانمان نەئەگەیشتنە یەکتری
کەچی لە چپە چپی شعرەکانی یەکتر بە ئاگا ئەهاتینەوە...
من بەیانیان هەر بە چپە ...
شعرێکم بانگی ئەکردیو تۆ ئەهاتی
تۆش ئێواران هەر بەچپە ...
شیعرێکت بانگی ئەکردم
ئاگام لێبوو ئاواییەکت نەخشە کێشابوو لە شیعر ...



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

پڕبوو لەگەڕەکی چیرۆك ...
لە ماڵی بێدەرگای وشە...
لە هاوڕێی یەکپارچە شووشە...
پڕ پڕ لەوەرزی کریستاڵی ...
ئێواران کە خۆر هەڵئەهات
ئێمەسەرگەرمی بارین بووین
بارین بەسەر وشەو شیعرا...
بارین بەسەر ئێوارەی خامۆشی شارا
ئێمە خەریکی بارین بووین
بەسەر چاوی نیشتمانا ...
بارین بەسەر گریانی تەڕی دایکانا...
بارین بەسەر ڕووی بارانا
من ئەمەوێ شتێك بنوسم ...
لە نێوان تورە بوونو گریانی هەورا
لە تەڕبوونی سەوزە گیابچێ ...
ئەمەوێ شتێك بنوسم
لە نێوان شریخەی گوللەو هەواڵی مردنێکا
لە هەڵفڕینی پەپولەیەك بچێ...



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

شتێك بنوسم لەنێوان چەپۆكانی دەریاو
شەكەت بوونی كەنارا
لە ڕێبوارێكی سەرسام بچیٚ
كە بیر لەكۆتایی شەپۆلەكان دەكاتەوە
ئەمەویٚ شتێك بنوسم
لەنێوان ژەنینی شیعرێك و...
خوێندنەوەی پارچەیەك مۆسیقادا ...
لە دەنگی پچڕانی تاڵە ژێیەك بچیٚ
كە ئارامی ڕۆحم ئەشێوێنیٚ
شتێكت بۆ بنوسم
لە نێوان دڵی ڕەق و... بەردی نەرما
لە ترپەی دڵی شیعرەكانی خۆت بچیٚ
كە ئێستەش گوێم لێیانە
ئەمەویٚ هەموو ئەوانەت بۆ بنووسم
یانی : شتێك بۆت بگریم .



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

**بۆ باوکم، ئەو شاعیرەی تاقە یەك شیعری نەنووسیی**

ئەو شاعیری جوانییەکان بوو
ئەم نهێنییە لەنێوان باوکم خۆیو گوڵەکانیدا مایەوە
تا بەیانییەك خۆم گوێم لێبوو
گوڵێك بانگی بابەی کردوو
دڵۆپێ شەونمی خۆیی دایێ
ئەمە مزنترین شیعر نییە؟
ئەو شیعر بوونە نییە
پەنجەی شاعیرانی جیهان نەخشەی بۆ کێشا
هەرلە "ئەدۆنیس"ە وە تا "شێرکۆ بێکەس"
ئەو مەزن بوو
لە تەمەنیدا بەردی نەخستە سەر بەرد
بەنیازی دروستکردنی دیوار
ئەمە مەزنبوون نییە
ئەمە نێوەرۆکی فەنتازیترین
چیرۆك و ڕۆمانەکانی دنیا نییە ؟
هەرلە "قەدیسی نیکۆس "ە وە تا "حەساری شیرزاد حەسەن"



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

ئەو منالێك بوو بۆ خۆی
لە تەمەنیدا هاوەڵێکی لێی حاڵی نەبوو
ئەمە زمانی شیعری هەموو شاعیرانی دنیا نییە؟
هەر لە "ڕامبۆ"وە تا"لەتیف هەڵمەت"
ئەو شاعیری ژنانیش بوو
ئەم ڕاستییە یان لە دایکم بپرسن
من ڕۆژێ دایکمم نەبینی
تەرمی قسەکانی خۆی
تەرمی بۆ چوونەکانی خۆی
تەرمی پێشنیارەکانی... بنێژێ
من دایکمم نەبینی لە نێو کفنی ژیانا
دایکم مرۆڤ بوو
لەهەمووی گرنگتر دایکم بەزیندوویی ژیا
ئەمە پیاوی زیندوی نێو خەونی ژنەکانی دنیا نییە
هەرلە "دۆریس لیسینگ"ەوە تا "فروغ و کەژاڵ ئەحمەد"
ئەو بۆ خۆی تۆوی گومان بوو
ئەم نهێنییە لە نێوان باوکم و تەزبیحەکانیدا مایەوە
تەزبیحەکانی باوکم زۆر درێژ بوون
هەر موروەی لەڕەنگێ بوون
هەندێجار ئەو سەری تەزیحەکانی باوکم ئەگەییە ئاسمان
هەندێ جاریش خەمە مووروی ڕۆئەکردە سەر زەمین و



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

ماڵەکەیان پڕ ئەکردین لە خشەخش
کەسێ نەبوو دان بە تەزبیحەکانی باوکمدا بنێ
باوکم هیچ سەبیلێکی بۆ تەزبیحەکانی خۆی هەڵنەبژارد
بەبێ سەبیل،
هەدێ جار کە توورە دەبوو
بەنەکەشی لا ئەبردوو
هەر بەبێ بەن
موورو بڵاوەیان ئەکردوو
پاشان خۆیشی لە نێویاندا دا ئەنیشت و
زیاد لە سەد جار
بە موورو وێنەی ئەکێشاو تێکی ئەدا.
وێنەی خەمێکی ئەکێشا
بەفرمێسکی چاوەکانی مووروەکانی تەڕ تەڕ ئەکرد.
هەندێ مووروی خوار دائەنا
ئەیوت ئەمە وێنەی ژیانە
مووروویەکی سپی لەت ئەکرد
لەناوەوە ڕەشایی چاومانی ئەبرد
ئەیوت ئەمە دەروونی جوانی ئینسانە
باوکم وتی:
بەم مووروە گوماناویانە
وێنەی هەمووشتێ ئەکێشم



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

بەڵام ئەیوت :
بۆخۆم نەبێ ببمە مووروو
ناتوانم وێنەی مردنتان بۆ بکێشم
زۆر جا مووروی بەجێماوی چاوی باوکم
لە سوچێکا، لەبن چڵێ لە سەوزایی حەوشەکەدا
لە ژێر پاژنەی پێڵاوێکا
زۆر جار مووروی بەجێکاوم لە کۆڵانا
لەبەر دەرگای هەنێ ماڵ ئەدۆزییەوە
من بۆ خۆم باوکمم دیوە
لە زستانا لەژێر مورووودا خەوتووە
بۆ بەیانیش زۆر ڕازی بوو لە شەوەکەو
ئەیوت: سەرمام نەناسیوە
من بۆ خۆم باوکمم دیوە
کاتێ پارووی لەنان ئەگرت
چەند مووروویەکی تێئەکرد
دواییش ئەیوت:
شوکور بۆئەم پاروەە خۆشەو
دەستی بۆ سمێڵی ئەبرد.
باوکمم دیوە،
مووروی بەخشیوە بەدایکم نەیویستووە
باوکم زۆر جا گومانی ئەهێناو ئەبرد



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

مووررووی تازەی لێدروست ئەکرد
بەوکارەی باوکم ئەم ئەرزە
ئەکەوتە سەر شۆکەو لەرزە
باوکم دەروونێکی ڕوون بوو
گەر درۆ نەبێ بۆ دوایین جار
خۆیشی بووبە مووررو ون بوو.

***دۆریس لیسینگ، ژنە ڕۆشنبیری بەر لینییە،**
**خاوەنی ڕۆمانی"یاداشتی زێڕین"گە دواتر بە ئینجیلی مێگەرا ناسرا**



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

بووم بە گۆرانی خەمینان
هەر پەنجەی ژان من ئەژەنێ
لە هەرکوێیەك هەناسەی غەریبانە بێ
لێو ئەنێ بە لێوی منی شمشاڵەوە
خەم لە دوای خەم
ئاوازی خەمین ئەژەنێ
لەپڕ کۆستێ لەپڕ پۆلێ هەواڵی خەم
خۆیان ئەکەن بە نێو لق وپۆی درەختی منی زاما
لەپڕ ئەشکێ لەپڕ بەستەیەکی ماتەم
دێ خۆی ئەکا بەژووری دڵی ئاراما
ئەم سەحەرەش قەدەر هات
حەسرەتی هێنا
لەپڕ هات هەروەك هاتنی
پەلکە زێڕینە دوای باران
هات وەك ئەسرین
خۆی خزاندە نێو چاومان
لەپڕ هەروەك
هەناسەی سپی دەمەو بەیان
هەروەك دەنگی مەلولی هەڵەبجە مەلول
هەمووماني لە باموك بێدار کردەوە
هەواڵێك پڕتەو



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

وەك نەوای حەزینی دڵی شمشاڵێ
وەك فڕكە فڕكەی چۆلەكەی بن پاسارێ
هەواڵێك مانشێتی حوزنەو
مۆسقای دڵی خەمینان
شمشاڵێ وەك ژان بیژەنێ
بۆ كۆچی ئێوە ئازیزان
كەوتە لێدان.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com



تابلۆی هەنەرمەند: ئامۆق عەلی قادر

# ژیان لە عەرعەر گسك نادات



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

هاتە ئێرە
(ژیان)ی وەپێش خۆی ناو بردی،
بەر لە هاتنی ئەو لێرە،
(ژیان) ڕۆژانە ئەباری،
ڕۆژانە ئەچووە سەرکانیو
پرچی بەخوڕە خوڕ تەڕ ئەکرد،
بەر لەهاتنی ئەو لادێکەمان پڕ بوو لەژیان
لەگەڵ چرپەی پاساریدا،
لەگەڵ ورتە ورتی زەردەو مانگەشەودا بەیەکەوە،
ژیان لێرە گسکی بەردەرگای دڵمانو
گسکی خەمەکانی ئەدا.
کە ئەوهات هەمووشتێ تەواو،
هات ژیانی وەپێش خۆیناو بردی
بۆ لای لم بۆ لای چاڵ، بردی بۆ عەرعەر،
(ژیان) لەوێ زمانی کەسیانی نەزانی،
نەزمانی لم، نەزمانی چاڵ
نەزمانی بەردینی عەرعەر،
ئیتر لەوێ (ژیان) زمانی بیر چوویەوە
گسکدانی بیر چوویەوە.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

لەودیو گومانەوە بۆ سەکینەت بگەڕێن
لەودیو گومانەوە بۆ دڵنیایی
لەو دیو خەوەوە بۆ ئاگایی
لەو دیو کۆمەڵگەوە بۆ "من" بگەڕێن
لەو دیو منەوە بۆ "تۆ"
لەودیو قسەوە بۆ حەقیقەت
لەو دیو زمانەوە بۆ شتەکان
لەو دیو گوناهەوە بۆ ئەشق
لەو دیو مردنەوە بۆ ژیان بگەڕێن
گەمەیەکی بێمانایە بتەوێ
بەو ساناییە لە جوانییەکان بگەیت
سروشت خانە گومانانە،
جوانییەکانی داپۆشیوە.
ئەودیو دیوارەکانی ئێستە
پڕە لە نهێنی ئایندە
ئەودیو کەوانەکانی سیاسەت
پڕە لە وشەی گورجو گۆڵو نەفەس درێژ
ئەویو بازگەکانی گوناه
پڕە لەجوانی
هاوڕێ، ئەودیو زۆر نزیکە
شیعر



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

ئەودیوی شتەکانە
ئەودیو ئەستێرەیەکە، پڕلە ژیانی جوان
لەوێ ڕووبار
ڕائەوەستێ پشوو ئەدا
سەربەستە بەرەو کوێ ئەڕوا
دەریا جلی ئاو لائەباو
سینەی ئەکاتە پێشەنگا
لەوێ مانگ بەزمانی تریفە
منالآن ئەخاتە سەما
خۆر وازنامەی خۆی ئەنووسێ و
ماچی کلوە بەفر ئەکا
لەوێ جوانی دڵی بوونە،
ڕەنگی حەقیقەت ئەگۆڕێ
لە تاو شەرمی جوانیدا شاخ
دڵۆپ، دڵۆپ دائەچۆڕێ
لەوێ کاتێ ڕوح هەڵئەکا
جەستە بەرز بەرز ئەبێتەوە
خەیاڵیش وا ژان ئەیگرێ
شیعری لێبەر ئەبێتەوە.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com



تابلۆی هەنەرمەند: نامق عەلی قادر

# گریان و مەرگ ئەنووسێ



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

کەسێك لێرە مەرگ ئەڕژێنێ بەسەر پرچی تاڤگەکانا ..
مەرگ ئەڕژێنێ بەسەر لق‌و پەنجەی سەوزی درەختەکانا..
کەسێك هاتووەوە بەگژ
خەیاڵی مەولەوی‌و عیرفانی مەحویدا ئەچێ،
گڕ لەشیعری بادی سەبا بەرئەدات‌و
قەصیدەی مەرگ ئەنووسێ،
کەسێ هاتووە دارگوێزەکان موتوربەی تیرۆر ئەکات‌و
ترس ئەڕژێنێ بەسەر ئەلف‌و بێی (باڵدار)ا،
کەسێ هاتۆتە ئەم خاکە
بەزمانی ئاگر ئەنووسێ‌و بەبارووت بیر ئەکاتەوە،
مەرگ ئەخزێنێتە نێو تەوقەو
گریان ئەدا لەبەرۆکی بوکی جەژن،
هاتووە زەخرەفەی مەرگ ئەدا لەبەرگی چوکلێت‌و
نۆتەی گریان ئەخاتە نێو گۆرانی مناڵانەوە،
تیرۆر هاتۆتە ئەم خاکە شەکەتەوەو
ئازار ئەکا بەگەرووی کانییەکانماندا و
عەزاب ئەبڕێ بەگەردنی رووبارماندا،
تیرۆر هاتۆتە ئەم خاکە
پەلکە زێڕینەی ئاشنام بشواتەوە،
خۆرم کوێرکاو ناوی سپیم ڕەشکاتەوە.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

**٢٠٠٣/٧/١٠**

***هەڵوێست**

ئێوارەیەك لەژێر سێبەری دارێكا
گەڵایەكی دایەدەستم بادی سەبا
تومەز نامەی ئەوشاخەیە
هەڵوێستی خۆی تیا نووسیوە
دژ بەگیرانی مامۆستا.

**٢٠٠٣/٨/١٠**

*** باران**

بەهاوینیش
ئاسمان وچان نادا، یاران
ئەوە وردە خەمی ئەوە
دێتەوە لەشێوەی باران



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

٢٠٠٣/٩/١٠

***داربەڕوو**

داربەڕوویەکی پەل بەستراو
لەسەر ڕووی ئاو
بۆ باوەشی شاخ ئەپرسێ
ئەوە پەنجەی مامۆستا بوو
بۆ قەڵەمێك ئەگەڕا
تا پێی بنووسێ.

٢٠٠٣/١٠/١٠

*** گەرووی بولبول**

ئەم سەحەرە
لەخوار گوندەکەی خۆمانا
دیم بولبولێك
باخێکی بەئاگا هێنا
وەختێ بولبول دوا ئاوازی
بۆ زیندانییەکی بێتاوان دەرئەهێنا.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

**٢٠٠٣/١١/١٠**

*** گلەیی**

دەزانم ئێستە چاوانت پڕ گلەین
گلەییەك وا پێئەچێ
هیچ زمانێ نەتوانێ بینوسێتەوە
مەگەر زمانی
کۆترێکی دڵ بریندار
کە ئاسمانی لێدزیوە
دەستی زۆردار.

**٢٠٠٣/١٢/١٠**

*** حەمرین**

شەوەو ئەستێرەیەك دیارە
ورشە ئەداو خەم ئەڕژێنێ
ئەوە چاوی مامۆستایە
لەپەنجەرەی زیندانەوە
ئەیەوێ حەمرین ببینێ.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

٢٠٠٤/١/١٠

*** دیاری خۆر**

ماوەیەکە کەخۆر هەڵدێ
دەڵێێ چەپکێ لە ڕۆشنایی
تەوێلی خۆی
لەماڵەوە بەجێدێڵێ
ئەمە ساڵێکە ئاوا دێ
شەوێك ئەمەم لەمانگ پرسی
مانگ بەتریفەو خەندە وتی:
ئەوە، ئەویارە
چەپکێ تیشکی خۆی ڕنیوە وەك دیارییەك
ناردوویەتی بۆ مامۆستا
تا لەبەرزایی تاریکی زیندانەوە
بەیانیان خۆرێ هەڵبێو شەبەق بدا.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

٢٠٠٤/٢/١٠
* ئەحمەد ئاوا
جۆگەیەك لەو گوندە هەیە
هەر خوڕەیدێو
ئاوی وردە خەم ئەدێرێ
تومەز ئەو خەمو خوڕەیە
زمانی حاڵی جۆگەیە
جێ پێی مامۆستا ئەژمێرێ.

٢٠٠٤/٣/١٠
* هەر ئەو گوندە
هەر لەو گوندە ئەم بەهارە
پەرەسێلکەیەك
بۆ خەڵکی ئاوایی نووسی
لێرە دەنگو
تەرتیلە پڕلەجۆشەکەی
سەحەرانێ هەست پێ ناکەم
بۆیە ئەمساڵ
لەم بن پاسارە مەلولە
هێلانەی خۆم دروستناکەم.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

٢٠٠٤/٤/١٠

*** خەمی وڵات**

شەوێك لەدەریای ئاسمانا
ئەستێرەیەك دەكشێ و دەڕوات
ئەوە دڵی مامۆستایە
دەجۆشێ بۆ خەمی وڵات.

٢٠٠٤/٥/١٠

*** ئازادی وای وت**

تاقەڵەمێك
بەدەست بەستراوی بمێنێ
من مەخەنە نێو ئارم و
مەمكەن بەشیعاری حزبەكان
تا قەڵەمێك زیندانی بێ
بمخەنە دەرەوەی فەرهەنگ
بمكەنە دەرەوەی زمان.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

٢٠٠٤/٦/١٠

* چاوەڕوانی

ئەمجارەیان چاوەڕوانی
دەڕژێتە سەر پەڕەی شیعرم
تا ئەوکاتەی
ئازیزانە بۆ تەوقەیەك
دەستت دەگرم.



PDF 4 KURD

PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com



ئێستەو منداڵیم دوو گۆرانی ، هیچیان لەیەك ناچن



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

بەمندالّی خۆم ئەدا بەدەم سەباوە ،
ئەیبردم بۆمالّی گزنگ
خۆم ئەدایە بەربارینی کپی بەفر
ئەیبردم بۆمالّی سپیی ئاسمانەکان ،
بەمنالّی ئەچوومە ژێر چەتری هەور ،
ئاسمان دەستی تەڕی بەسەر هاروهاجیما ئەهێنا ،
نیشتمانی من بەمنالّی
باخچەی دەم ماڵەکەمانبوو ،
کەماموٚستاکەمان ئەیوت :
( نیشتمان دایکە )
ئەم دێڕە بۆ من شیعرێ بوو
ئێوارە ئەگەڕامەوە
ڕووخساری داکم و باخچەکەم لێئەشێوا ،
چ خۆشەویسیتبوو منالّی ،
دەیان ئێوارەم لەبیرە
ماچی گولّێگم کردووە
لەجیاتی ڕووخساری دایکم
سەدان ئێوارەم لەبیرە
بۆنی دایکمم کردووە
لەبری چەپکێ لەڕەیحانە ،



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD



کەمناڵبووم باخچەکەو دایکم و نیشتمان
هەر یەك شتبوون
لەنیشتمانی مناڵیما
نەخەلْفەیەکم ئە بینی
سەنگەری لەچلْ گرتبیْ و
نەخوێنی مەلێکم ئەدی بەسەرگوڵێکا ڕژابیْ ،
نیشتمانی من بەمناڵی باخچەکەبوو ،
نەپەلکە گیا
خیانەتنامەی ئەنووسییەوە دژ بەگەلاْو
نەشەڕگەیەکم ئەبینی
تەرمی تەڕی گەلاْکانی تیا کوژرابیْ



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD



ئازیزەکەی لەباوەشیا
ئاسمان بەسەر سەریانەوە
دۆشەکەیەك لەزیخو لم
وەك سەری لەسەر سەرینی حەریر دابێ
لەوەتەی هەم
کەسم نەدیوە ئاوا قووڵ.. خەونی ئارام بردبێتی
کەسم نەدیوە ئاوا دوور.. پشوو بدا
کەسم وا بێخەم خۆیو ئازیزترین کەسی
وازیان لە (هەموو) هێنابێ
(ئەگەر بابێ ئەگەر باران)
ئەوان هەر بەسەر سنگی یەکترەوە
چپەچپی خۆیان ئەکەن
ماچی بێدەنگی ئەگۆڕنەوە
ئێستە هەموو شتێکی ئەوان،
تەنیا ماچ گۆڕینەوەیە
کە کانییەکی نوی ئەتەقێ
ئەوان ماچی ئەگۆڕنەوە
کە باران.. بەفرێ ئەبارێ
ئەوان لەژێر ئاسمانا ماچی خۆیان ئەگۆڕنەوە



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD



وازیان لەهەموو شتێ هێناوە
نەهەواڵی ڕۆژنامەکان ئەخوێننەوە
نەسەیری تیڤییەکان ئەکەن
نە میلی ڕادیۆ بائەدەن
بێئاگا لەزەماوەندو
بێئاگا لە کوژراوەکان
هیچ زەماوەندێك خونچەیەك، لەلای ئەوان ناکاتەوە
هیچ مەرگێك قرتێلەی خەمێك،
نادا لەبەرۆکی ئەوان
لەکۆلانێکی ئارامان
ئەوان .. لەماڵی هێمنی خۆیاندان
هەموو ساڵێ ئەم کاتانە
(شانۆ)یەك یان (دەرهێنەر)ێ
ئارامی ئەوان تێکئەداو
ئەیانباتە نێو دەنگە دەنگی هۆڵەکان
ڕۆژنامەکان هەموو ساڵێ
خەوی عومەر پڕ.. پڕ ئەکەن لەخشە خش
هەموو ساڵێ ئەم کاتانە
دیسان ئەبێ کۆڵی عومەر
گرێی قورسی ئەم چیرۆکانە هەڵگرێ
یان ڕێگە بدا بەشیعرێ



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

بچێته نێو خەونەکانیو لەو سەرەوه
بەسینەی پڕو چاوی تەڕ بێته دەرێ
ئەبێ دیسان.. چرکه چرکی فلاشەکان
عومەر باس کەن
بەرنامه لەدوای بەرنامه
هەر قەوانەکه سەربخەن
ئەبێ دیسان بچێته نێو
بەرنامەی فیستیڤاڵەکان
دەبێ عومەر
ئەمساڵیش بکرێته پۆستەر
بەژێر دەنگو قرە قرِی چاپخانەدا
هەزاران جار بەڵکو بەسەدان هەزار جار
بێتو بروا
دواتر کەسێك بەچوار بزمار
دڵی ئەم پۆستەره کون کاو
هەڵی واسێ
وارِێك ئەکەوێ هەندێ جار
ئەم بزماره
بەر قاچی عومەر ئەکەوێو
دڵی پڕ ئەکا لەئازار
دیسان عومەر، ئەکرێ



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

**بەمانشێتی زلی**
**ڕۆژنامەکان**
**هەردوو ڕۆژ دوای شانزەی سێ**
**ڕۆژنامەکە دەخرێتە ژێر سینییەك**
**پاقلاوەی وەفا**
**بۆ ئاهەنگی ئاشتەوایی**
**هەڵەبجەی شەهیدو بەغا.**



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

ئەوشەو منالّیم لەکاتی گەڕانەوەیدا
بەسەر ڕێگای تریفەوە
ڕێی لێ ون بوو... ونبوو
خۆیو گشت دێڕە سپییەکان،
خۆیو بەهانەکانی شەو،
خۆیو گشت شیعرەکانی مانگ،
ڕێی هاتنەوەیان لێدزرا
لەوشەوەدا کە بەزەحمەت
منالّی من گەییە لای مانگ،
یادی پڕ بوو بوو لەتریفە
لەڕەنگی سپیو لە ئازادی
لەگەڕانەوەیدا ون بوو،
ئێستەش نازانم پەیامی
مانگی گەورە بۆ من چی بوو،
ئێستەش منی گەورە نازانم
مانگ چۆن شیعری سپی نەنووسیێو
خەیالّی بۆ هێندە درێژەو
نیگاکانی هێندە ناسک.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

دڵم لەسەر ڕێتە ئەی ماه
دەس لەسەر چاو چاوەڕوانە
لە كەناری ئێوارەكانی شەعبانا
چاوەڕوانی بەیانییەكی ڕەمەزانە
دڵم هاتۆتە سەر زارم
وەك كەنارییەكی عاشق
بۆنی بەهاری كردبێ
بەدەشتی ئەو ئاسمانەوە
بەتەمایە بچێتەنێو سینەی
شیعرێكی جوانەوە
یاخود بڕژێتە نێو لەپی
دەستی پڕ لە پاڕانەوە
چاوەڕوانم ئەی ماه سینەم
پڕكەی لە پەپوولەی نزا
جامی دڵم مەست مەست بكەی
بەشەرابی ویردوو تەقوا
وەرە لەدەستمی بكەوە
ئەو زنجیرە ڕەشەی تاوان
ئازادمكەو بمبەرەوە
بۆسەر بەرماڵ ماڵە باوان



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

ئەگەرنامن مەلەوانی
بێجەستی نێو گوناهانم
بەبیٚ سەولٚو بێکەنارو
بێئەدرەسی ئازیزانم
خوٚزگە دێیتو ئەم شەوگارەی
دەروون ڕووناك ئەکەیتەوە
چی گوناهی ئەو ساڵەمە
ئەیبەیتەوە ئەیبەیتەوە
خوٚزگە ئەهاتی بەقوربان
هەموو بوونم چاوەڕوانە
چاوەڕوانم بەتوٚوە ژیان و
بێتوٚ چارم خنکانە
دلٚم زاماری سێسەد زامە
مەر سی پەنجەی مەرهەمینی توٚ
بکا تیماری ئەم زامانە
ڕوٚحم بێتەوە سەرخوٚ.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com



بەشێك لەحیكایەتی باوكم ، بەسەر چڵێ لەئێستاوە



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

لە.. .. .. .. خوا
گەورەتر نەبوو ...............
باوكم هەر لیٚوی ئەجولیّ و
حیكایەت ئەچنیّ،
وەلیّ من
چاوم لە پەنجەرەكەیەو
بیرم بەسەر چلیّ لەئیٚستا وە
گەلایەكی لیٚبەربوّ وە
لەودیو بەربونەوەی گەلاكەوە
ئایندە دیّ
باوكم هەر لیٚوی ئەجولیّ
و .. .. .. ..
حیكایەت ئەچنیّ
و .. .. ..
من لیٚی ناگەم
باوكم زوّر جار
وشەیەك لەحیكایەتەكەی خوّی



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

ئەخاتە نێو ئێستامەوە
من لەهەستی بەربوونەوەی
گەڵاکە ڕا ئەچڵەکێنێ
ناچار، منی دەستەڵاتدار
بەربوونەوی
گەڵاکە ڕائەگرم تاکو
وشەی نێو
حیکایەتەکەی باوکم
کەبەپاچ و خاکەنازێ
فرێی دایە ئێستامەوە
دەر ئەهێنم .
باوکم هەر لێوی ئەجوڵێ
و.. .. ..
حیکایەت ئەچنێ
هەبوو نەبوو ............
منیش
چاوم لەپەنجەرەکەو
بیرم بەسەر چڵێ لەئێستاوە
وا گەڵایەك بەربویەوە
دەنگیبایەك
بۆنیکۆنی



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

کتێبی قوتابخانەکان
ئەدا لەبیر کردنەوەکانم .
باوکم هەر لێوی ئەجوڵێ
و .. .. .. ..
منیش بەشوێن
بای هارەوە
بەشوێن
لاپەڕەی دڕاوی
کتێبی قوتابخانەکانەوە
بەرلەوەی بۆنی لاپەڕە
لولکراوەکان
بمبەنەوە بەردەم ئەشکەوت
بەرلەوەی
خەتی بزماری
سەر بەردەکان بخوێنمەوە
ئێشی پاچ و خاکەنازێ
کەبەر پێی
ئێستام ئەکەوێ
بەشوێن (با) کەوە
ڕامئەگرێ و
لاپەڕە لولکراوەکانیش



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

بەتۆزێ تیپ
ئەدەمەوە لەکتێبەکان .
باوکم هەر لێوی ئەجوڵێ
و.. .. .. ..
حیکایەت ئەچنێ
و .. .. ..
حاڵی نابم
دایکم سفرەکە ڕائەخاو
بەئاماژە بانگم ئەکا
خۆم بەرلەوەی
هەردوو چاوم
بەپەنجەرە شینەکەوە
لێکەمەوە
دایکم دێت
و.. .. ..
بە فەقیانەی کراسەکەی
ئەمتەکێنێ
نەبا، ماڵەکەمان پڕ بێ
لەمێروله
بەقسەی دایکم
کاتێ کتێب ئەخوێنمەوە



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

یا سەیری پەنجەرە ئەکەم
خۆم پڕ ئەبم لەمێروولەو
ئەوانیش هەراسان ئەکەم
دایکم،
بەفەقیانە
باش باش ئەمتەکێنێ
باوکیشم خاکەناز دێنێ
تا وشەیەك
لەحیکایەتەکەی سەرزاری
بڕ ژێنێتە ئێستامەوە
باوکم بەرلەوەی
گوێبگرێ یان تێبگا
بەخاکەناز
جەستەم پڕ ئەکا لەزامو
ئێستام لە خۆڵو خاشاکو
لە وردە بلۆك .
باوکم هەر لێوی ئەجوڵێ
و.. .. .. ..
حیکایەت ئەچنێ
من چاوم لە پەنجەرەکەیەو
فڕینی سەیری باڵندەکان



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

ئاوا بوونی سەیری هەتاو
دابارینی سەیری باران
چاوم لە پەنجەرەکەیەو
هات و چۆی سەیری ئەو خەڵکە
قژی درێژی شەقامەکان
شێوەی سەیری ئەو درەختە
وەرینی سەیری گەڵاکان
دایکم هەر سفرە ڕائەخاو
منیش پڕم لە مێروولەو
لێنابمەوە
باوکم هەر لێوی ئەجولێ
هەبوو نەبوو .. .. ..
منیش
چاوم لە پەنجەرەکەیەو
بیرم بەسەر چلێ لەئێستاوە
وا گەڵایەك بەر بوویەوە
لەودیو بەر بوونەوەی
گەڵاکەوە ئاییندە دێ
لەنێو حیکایەتەکەی باوکما
خێوێك خەڕکەکەی
دەستی ئەجولێنێ



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

نهێنییەك دێنیٚو دەبا
بەتەمایە
خیانەت لەباوكم بكا
من خوٚم خێوەكە ئەبینم
ئاگام لەنهێنی شاراوەی چاوانییەتی
وەلیٚ لەزمانی باوكم
هیچ حالّی نابم .
باوكم هەر لێوی ئەجولّیٚ
منیش هەر بیر ئەكەمەوە
داخوٚ هاتنی ئایندەو
نهینی شاراوەی خێوی
ئەم شیعرە چوٚن تەواو ئەكا .
باوكم هەر لێوی ئەجولیٚ
حیكایەت ئە چنیٚ.
هەبوو نەبوو كەس لە .. .. ..

* مانای ئەم شیعرە، لەیەكەم دێڕی دەقەكەدا كوٚتایی دیٚ .



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

لەنێو پەیکەری شیعرێکی
(غەریبە)کەی خاكو خۆڵا
بەچلو چێوی ڕوحیانەتی
(قەلەندەرە)ێکی ڕووتەوە
کاتێ کە دێ .... خاوەنشکۆ
ئاستانەکەم...
هەروەك لەخەیاڵی (مەولەوی)ت هەڵکێشابێ
(چوون ڕووی ئازیزان نەزاکەت ئەبڕێ بەبەرگی خۆیان)
وەختێ ئەو دێ....
بایەك لەگەڵ خۆیا دێنێ
گیاکێویلەی نێو تابلۆکە دەشنێتەوە
کاتێ کەدێ ڕیحانەی باخچەکانیش دێن
کەلەدیوەخانی (من)ا دائەنیشێ
خاوەنشکۆ...
حەوشەکە دێتە ژوورەوە
دیوەخان پڕدەبێ لەڕەنگ
لەبۆنی هەرچوار وەزەرەکە
وەختێ ئەودێ پەنجەرەکان واڵا ئەبن
دەرگاکانم ئەکرێنەوە
خۆر لەپەنجەرەوە بزەو
مانگیش لەدەرگاوە سڵاو



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

خاوەنشکۆ کاتێ کەدێ...
ڕۆژوو شەو لەگەڵ یەکا دێن
پێڵاویان لەسەر پێ ناوەو
دەستیان لەدەستی یەکایە
دێنماڵەکەم تەژی ئەکەن لەسەرسامی
وەختێ ڕۆژوو شەو ئەبینێ
خاوەنشکۆ....
شانیان بەشانی یەکەوە
لەسەر ڕاخەرێ دانیشتوون
هەڵیاندەگرێو ئەیانخاتە
نێو دەفتەری یادگاری باخەڵیەوە
ئێستەش شەوورۆژ دوو یاری
لەیەکدووری یادگاری خاوەن شکۆن
کاتێ کەدێی زمانم پڕ ئەبێ لە خەیاڵ
تەماشاکانم لەشیعر
هەمیشە بەخێر خاوەنشکۆ...
بەخێرهاتی
بۆ ئاستانەی شیعری تینوم.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

گوڵ ناهێڵێ لەخۆی جوانتر ببینین،
پەپولەیەك ڕێگە نادا
بەدوای جوانتر لەخۆیدا بگەڕێین،
جوانی لە هەر لا...
بەخۆیەوە ڕاماندێنێ
تا جوانتر لەو کەشف نەکەین.
ئەوە گۆرانی بولبولێ پڕماندەکا
تا بۆ ئاوازی بەسۆزتر گوێ هەڵنەخەین،
دایك بەمناڵی وا ئەڵێ:
تا گەورە بووین
بە ئامێزی میهرەبانتر باوەڕ نەکەین،
خۆشەویستیێ کوێرمان دەکا،
نەبا بە (خۆشەویستی) خۆی بگەین،
دونیا بەخۆی دەمانکوژێ
تا بە دونیایەکی تر نەگەین.

***شەماڵی ئەم چەند دێڕە لەوێوە هەڵیکرد**
**لەخواردێکەوە، لە ڕۆمانی**
**(فرانسیسکۆس قەدیس منا).**



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com



تابلۆی هەنەرمەند: نامق عەلی قادر

له وشه تا..... لەڕوونی ئاو



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

لێره بەداو
بەكاتو زەمانی ئەڤین
ئەمەوێ..
بەسەر جەستەیشیعرتەوه
كانی مانا لێبدەمو
لەسەر زەوی وشەكانتا
وردە گییای ماچ بڕوێنم
لەم دەرگایەوە ئەمەوێ
ئاوازێك بەبە نەمریتا ببڕمو
مردن لەبیر شیعرەكانم ببەمەوه
لەم دەرگایەوە ئەمەوێ
بتهێنمەوە بۆ لای باران
سەرخەوێكی ژیان بشكێنو
سەلامێ بكەی لە یاران
ئەمەوێ لەم پەنجەرەوه
جارێكی تر گوێ لەچپەی هەتاو بگری
كاتێ بەیان هاوار دەكا
گوێ لەڕامانی مانگ بگری
وەختێ شەو
خەودا ئەگیرسێنێ
دەمەوێ بێیەوه ئێره



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

له وشەنا....
لەڕوونی ئاو
شیعرێکی تازە بنووسی
لەوشەنا.. لە گڕوگاڵی مناڵی
ناونیشانی دیوانەکەت هەڵبژێری
لە وشە نا...
لە ئەڤین ڕۆمانێك بچنی
لە وشە نا....
لەیادەوەری سنەوبەر
ژیانی خۆت بنووسیەوە
ئەمەوێ بێیتەوە ئێرە
بەردەم نووسینەوەی باوە
ئاسمان نا...
تا ماڵی باران
کەنار نا...
تا دەریا بمبەی
بێیتەوە ئێرە مەغریبێ
ڕەشنووسەکان کۆکەیتەوەو
بیانخوێنی بەگوێی خۆرا.



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

PDF 4 KURD

تاریکە چاوی نووسینم خوادایە
ببوورە ئەم هەموو عەرزو حاڵی خەتایە
عەرزو حاڵێکی خەجاڵەت دێتە بەردەرگای ئەوین
قەترەیەك پاکی بەرێ...تا پێی بشۆری سەرزەمین
نییە ڕەنگو ڕووی بەندەییم خودایا
نییە ناڵەی پەشیمانیم دەرنایە
نییە نەشئەی گوڵانی تەوبە هاوار
لە حەوشەی ماڵی کەسمانا بەرامەو سۆز نایەتەخوار
خامۆشە دڵی شاغیری خامۆشو ناخودا
ناتوانێ (بەقانوونی تەجەننون شۆڕشێ ئینشا) بکا
چی بکەین ؟
کەس نییە حاشابکا لە بێتۆیی
(سەر ڕشتەیی دین بێ مەدەدی تۆ نییە حاشا)
چی بکەین؟
ئەم دڵانە (نەزیندوون ونەمردوون)
کوا..؟
نەغمەیی سوتانی دەروونێ لەچ لایەکەوە نایێ
چ خامۆشە ئێرەکانێ خودایە
دڵم پڕ پڕە ئەمما وشە نایە
وشە نایێتە تەحریرو بەیانی
ئەوی من ئەیبینمو خۆشت ئەیزانی



PDF created with pdfFactory Pro trial version www.pdffactory.com

